جیهانگیری ئەمریکا

# لە داکەوتندا

به پێنووسی :-
سەرکردە؛ إبراهیم عەسیری
و؛ پێشڕەو موجاهید





لە دوا دەرکەوتنی باراك ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکا لە هۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە نیویۆرك؛ بارك ئۆباما وتارێکی پێشکەش کرد وبە شێوەیەکی گشتیانە باسی لە چەند بابەتێکدا کرد، بانگەشەیەك کە لە یەك ئاڕاستەدا بوو، ئەویش باسی یەکگرتن وگشتگیری‌و، پاشان وردتر باسی "جیهانگیری - عولمة".

زۆر بەلامانەوە گرنگ نییە کەسایەتی ئەو سەرۆکە کێیە کە قسە دەکا، گرنگیش نییە سەر بە چ حیزب وپارتێکی ئەمریکایە، ئەوەی بە لای ئێمەوە گرنگە کە قسەکان گوزارش لە ئاڕاستەی سیاسەتی ئەمریکا ودیدی ئەمریکا دەکەن لەم قۆناغەدا .

یەکێك لەو درۆ گەورانەی بەردەوام بانگەشەی بۆ دەکرێ ئەوەیە کە دەڵێن؛ "ئەمە سیاسەتی ئۆبامایە"، یاخود ئەوە شێوازی ئۆبامایە، چۆن بڵێی سیاسەتی ئەمریکا فلان وفیسار سەرۆك دایدەڕێژن ونەخشەو وردەکارییەکانی دیاری دەکەن، دیارە ئەمەش هەڵەشەیەکی گەورەیە، ئەمریکا بە ئەنقەست بانگەشە بۆ ئەم دید وتیۆرییە دەکات، بۆ ئەوەی خۆی لە حەرەجی کارە نادروستەکانی ولێپرسینەوەی ئەو هەڵانەی لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا ڕوو دەدەن بدزێتەوە. ئەگەر باسی حیزب وپارتەکانیش بکەین؛ هەر لەسەر هەمان ڕێچکەدایە، لەگەڵ هەندێك وردەکاری زیاتردا .

بە گشتی؛ ئەم چەشنە سیاسەتە سیاسەتێکی فریوبەر و وەکو تەڵێکی شاراوەی ئەمریکایە کە بە کاری دەبا، وهەوڵ ئەدا لە ڕێگەی ئەم سیاسەتەیوە هەر هەڵەیەك لە سەردەمی سەرۆکێك لە سەرۆکەکانیدا ڕوویدات داپۆشێت وبیشارێتەوە، ئینگار نە ئینگار وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ. داگیکردنی ئەفغانستان وعێراق وهەموو ئەو هەڵوێست وکردارانەی هاوشانی ئەو پرۆسە داگیرکەرانە ڕوویاندا؛ تەنها ڕەنگدانەوەی سیاسەتی بۆشی دووەم

بوو. ئەوەی لە سووریاشدا ڕوو ئەدات وهەزاران کەس بە هۆیەوە ئەکوژرێن؛ ڕەنگدانەوەی سیاسەتی گۆشەگیرانەی ئۆبامایە ! یا ئەوەتا دەوتری؛ ئەوەی ڕوو دەدا کاریگەری سیاسەتی کۆمارییەکانە یاخود دیموکراتەکان. کە تەواوی فرت وفێڵ ودرۆ کردنە. بە داخیشەوە؛ زۆرێك لە موسوڵمانان وتەنانەت برێك لە سیاسەتمەدارانیش فریویان بەمە خواردەوەو، برێکیان دەبینی ودەبیستی دەڵێن ؛ با چاوەڕوانی سەرۆکی داهاتووی ئەمریکا بین، بەڵکو کاردانەوەیەکی باشتری بەرامبەر بە پرسەکانی ئێمە ببێ.

ئەو دیدە دروستەی پێویستە سیاسەتەکانی ئەمریکای لێوە ببینین؛ ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی ناوەندە جیا جیاکان بۆمان دەردەخەن ولە هەموو لایەکەوە دەخوێنرێتەوەو، دواتر لە ڕێی تێڕامانمان لە لێدوان وگوتار وبڕیارەکانی ئەمریکا، کە دەرەنجامی گفتوگۆ وکۆبوونەوەو مشتومڕی خاوەن بڕیارەکانی ئەو وڵاتەن. گومانیش لەوەدا نییە ئەو چێشتخانەی زۆربەی سیاسەتە ناوخۆیی ودەرەکییەکانی ئەمریکای لێوە ئامادە دەکرێ، هەر هەمان چێشتخانەیەو ! هەر یەك لە پارتەکانیش یەك لە دوای یەك ڕۆڵی خۆیان لەو چێشتخانەدا دەگێڕن. ئەوەی لە ئەنجامیشدا دەرەچێت؛ سەرۆکی ئەمریکا ڕۆڵی جێبەجێ کردنی لە ئەستۆ دەگرێت، ودەتوانین بڵێین کە ڕۆڵی سەرۆك لە زۆربەی کاتەکاندا ڕۆڵێکی جێبەجێکەر وئەنجامدەرانەیە .

ئەو سیاسەتەی بڕیار بە دەستان لە ئەمریکادا دایدەڕێژن؛ سیاسەتێکە کە بەردەوام ڕەچاوی باری ناوخۆیی ئەمریکا لە ڕووی ئابووری ولایەنەکانی ترەوە دەکاتو، لە هەمان کاتدا چاوی لە باری دەرەوەو دەرەکی وڵاتە. سیاسەتەکانی ئەمریکا ڕەچاوی تەواوی هێزەکانی دەرەوەی خۆیان دەکەن، وجووڵانەوەو سیاسەتی دەرەوەیان بە پێی پێوەری هێزی خۆیان لە ناوەوە دادەڕێژن. بۆیە ناکرێ هیچ سەرۆکێکی ئەمریکا لە کاتێکدا کە باری ئابووری وڵاتەکەی سست وخاوی بە خۆیەوە بینیبێ هێرش بۆ وڵاتێکی تر بەرێت وجەنگ بەرپاکا، چ ئەو سەرۆکە کۆماری بێ یاخود دیموکرات .

ئەگەر دەرکمان بەو پێشەکییەی سەرەوە کرد ودیدی خۆمان بۆ سیاسەتی ئەمریکا بە پێی ئەو تێڕوانینەوە دیاری کرد، کاری خوێندنەوەی ئەو قسەو گوفتارانەی سەرۆکی ئەمریکامان بۆ ئاسان دەبێت وسادەتر دەتوانین لە گۆشە جیا جیاکانی بگەین وقووڵایی وتارەکە ببینین .

سەرەتای گوتاری سەرۆك بە پرسی یەکبوون وگشتگیرییەوە دەستی پێکرد، کە لە ڕێی قسەکانەوە ئەوەی دووپات دەکردەوە چارەسەری کێشەکان پشتگیری کردن وپتەوکردنی جیهانگیری وعەولەمەیەو، تاکە چارەسەری مرۆڤایەتی لە بەهێزکردنی ئیدارەی ناوەندییانەی جیهان دایە .

پاشان گوتارەکە هاتە سەر باسی کۆتایی هاتنی جەنگی سارد ونەمانی مەترسی جەنگی ئەتۆمییەوە، وەك ئاماژەیەکە بە ئیدارەی تاك جەمسەرانەی جیهان، ئەگەرچی ئۆباما لە دوادا هاتەوە سەر ئەو خاڵەو گوتی: "کەسێك کە پێی وا بێ جیهانی ئەمڕۆ یەك دانە جەمسەر بەڕێوەی دەبات؛ بە هەڵەدا چووە". ئەم وەسف وگوزارشەش بۆ خۆی جۆرە بەهەڵەدا چوونێکە، کە بەردەوام ئەمریکا هەوڵی بۆ دەدا جیهانگیری وئیمپیریالەتی خۆی پێ لێك جیاکاتەوەو، ئەمەش شتێك نییە مرۆڤ بە ئاسانی بتوانێ متمانەی پێبکا. جیهانگیری لە دوای ڕووخانی جەمسەری سۆڤێتی هاتە سەرکاسەوە، ولە دوای ئەو ڕووداوەشدا؛ جیهان جگە لە شەڕ وشۆڕ وداگیرکردن وڕاکشانی هێز ودەسەڵاتی ئیمپریالی - لەسەر تەواوی ئاستەکاندا - شتێکی تری لە ئەمریکاوە نەبینی .

دواتر سەرۆك هاتە سەر باسی سیستمی سەرمایەداری جیهانگیرییەوەو، لەوێدا دانی بەوە نا کە سیستمی سەرمایەداری چینی ناوەندی زەرەرمەند کردووە .. ئەویش دانپیانانێکی زۆر سەرەکی نییە. چونکە سیستمی سەرمایەداری نەك تەنها زەرەر وزیان بە چینی ناوەند دەگەینێ – وەك سەرۆکی ئەمریکا ئاماژەی پێدەکا – بەڵکو بەرەو هەژاری ونەداری

دەبات. ڕووداوەكان ئەوە دووپات دەكەنەوە كە سیستمی سەرمایەداری خەڵك بەسەر دوو چین وكۆمەڵ دابەش دەكات؛ چینێك كە تا سەر نوقمی دەوڵەمەندی وپووڵ وپارەیە، چینێكی دیكەی نەدار ونەبوونیش. بۆیە كە باسی جیهانگیری دەكرێ؛ مانای ئەوەیە كۆمەڵە وڵاتێك بەرەو دەوڵەمەندی دەڕۆن وكۆمەڵە وڵاتێكی تریش لەو جیهانگیرییەدا زەرەرمەند وزیانگیر دەبن، ئەمەش سەرەنجامی یەكبوونی پێشوو بوو كە نەگەیشتە سەر .

بەڵام باسی لایەنە ئابوورییەكەی جیهانگیری زۆر درێژەی نەكێشا، كە باس چووە سەر لایەنی كلتووری وبەهایی دیموكراسی، وەك كلتوور وبەهایەكی ئەو دەوڵەتەی سەركردایەتی جیهانگیری دەكات. سەرۆك زۆری باس لە دیموكراسی كرد؛ بە دادپەروەری وئازادی وەسف كرد .. زۆری قسە لەسەر دادپەرییەوە كرد وگوتی: "مێژوو وڕووداوەكان پشتی ئێمە ئەگرن، وەك خەڵكانێكی دیموكرات"، جا ئایە مێژوو وڕووداوەكان وەك شایەتێكی بە درۆ لە ڕیزی ئەمریكادا دەوەستنەوە، یاخود ئەو ڕاستییانە دەدركێنن كە تەنانەت لە مناڵی موسوڵمانانیش ناشاردرێنەوە ؟

دادپەروەری ئەمریكا لەوەدا دیارە، كە هێرشی كردە سەر گەلی عێراق وسەدان هەزاری لێكوشتن وخەڵكی زیندانی كرد وئەشكەنجەو ئازاری دان وناموسی ئەتك كردن، هەموو جیهانیش ڕووداوەكانی زیندانی ئەبو غرێبی لە بیرە، كە چۆن سەرباز وسەربازە ژنەكانی ئەمریكا دەستیان بۆ خەڵكانێك درێژ دەكرد كە تەنانەت بڕیاری خۆشیان لە دەستدا نەبوو، لە زیندانهایەك؛ كە هیچ بەهایەكی مرۆڤایەتی نەیدەگرتنەوە. تا ئێستاش ئەمریكا دانە هەنگاوێكی دادپەروانەی بەرەو سزادانی ئەو تاوانبارانە نەناوە، بەڵكو وەك پاڵەوان وقارەمانانی جەنگ ڕێزیان لێنرا ودەتخۆشی‌یان لێكرا وهێمای پاڵەوانێتیان خرایە سەر شان. ئا ئەمەن تاوانەكانی ئەمریكا لە ئەفغانستان وعێراق، كە هەموو جیهان پێیان ئەزانێ؛ تەنانەت خودی ئەمریكاش نكوڵی لێ نەكردوون. بەڵام ئەمریكا حەز ئەكا خۆی

لەو تاوانانە بدزێتەوە وخەڵك فریو بداتو، تاوانەکان – بۆ نموونە – بە ئیدارەی بۆش‌ـەوە ببەستێتەوە، کە یەکێکە لەو ڕێگە خوار وخێچانەی باسمان کردن. باشە ئەگەر ئیدارەی ئۆباما بە تاوانەکانی ماوەی سەرۆکایەتی بۆش ڕازی نەبێ، بۆ چی تاکو ئێستا لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەنجامدەری ئەو تاوانانە نەکردووە ونەیداونەتە دادگای دادی نێودەوڵەتی؛ کە سەرۆکی ئەمریکا – بۆش - لە سەرووی لیستی ئەو تاوانبارانەوەیە ؟! بێ گومان ئەمە پرسیارێکی لۆژیکییەو، ڕاستی وئەخلاقی ئەو دیموکراسییە ئەمریکییەمان بۆ پوخت ئەکاتەوە.

دیارترین پرس وگەورەترین زوڵمێك کە دەتوانێ ڕاستی "دیموکراسی ئەمریکا"مان بۆ ئاشکراکات؛ پرسی فەلەستینە. فەلەستین ئەو پرسەیە کە هیچ کەس نییە لە جیهان دان بەوە نەنێت؛ ئیسرائیل دەوڵەتێکی داگیرکەرەو مافی گەلێکی تەواوی زەوت کردووە وستەمی لێکردوون. دەی؛ دادپەروەری ئەمریکا لە کوێیەو، بۆ چی دەست بۆ لادانی ئەم قەوارە داگیرکەرە نابات ودادپەروەرانە ڕەفتار لەگەڵ فەلەستینییەکان ناکا ؟ بەڵکو هەڵوێستی ئەمریکا زۆر لەوە خراپتر بووە، چونکە ئەو کۆمەك ویارمەتییە سیاسی وسەربازی وئابوورییەی بەردەوامی ئەمریکا نەبوایە بۆ ئیسرائیل، ئیسرائیل - وەك دەوڵەتێکی داگیرکەر - توانای ئەوەی نەدەبوو لەو هەموو ماوە درێژەدا بوەستێت وجێگیر بێت. دوا کۆمەکی گەورەی ئەمریکا بۆ ئیسرائیل تەنها چەند هەفتەیەك پێش بوو؛ کە ئیدارەی سەرۆك ئۆباما ٣٨ ملیار دۆلاری وەك کۆمەکی سەربازی پێشکەش بە ئیسرائیل کرد. ئیدی پێمان بڵێن؛ ئەوە کامە دادپەروەرییە باسی لێوە دەکەن ؟ باشە یارمەتیدانی مرۆڤی تاوانبار لە عورفی ئێوەدا بە تاوان حسێب ناکرێ ؟!

دواتر سەرۆك ئاماژەی بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ودەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکانی ناوچەکە کرد، ئەوەی سەرۆك وتی ئەوە بوو کە ئەو دیموکراسییەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن؛ بە هیچ جۆرێك لەگەڵ سیستمە حوکمڕانییەکانی ئەوێ تێکناکاتەوە. جا نازانین ئاخۆ جەنابی

سەرۆکی ئەمریکا لە رژێمی میسرِی توورە بووە بۆ نموونە ! .. هەر پیاوێکی سادەش دەرفەتی ئەوەی هەیە پرسیارێکی بچووکیان لێ بکا؛ ئەویش ئەوەیە کە: کێ بوو تا ئێستاو بەر لە شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی کۆمەکی رژێمە دیکتاتۆرییە عەرەبەکانی دەکرد، وکورسی ودەسەڵاتییانی قایم دەکرد ؟! مەگەر هەر خۆتان نەبوون ! ئەو کەسە کێ بوو کە دانی بە سیسی؛ کودەتاچییە سەربازییەکەی میسرِ نا، کە لە یەك تاکە رۆژدا زیاتر لە چوار هەزار خۆپیشاندەری کوشت ؟! ئەو کەسە کێیە کە تا ئێستا رێگەی بە بەشار ئەسەدی تاوانباری جەنگ داوە، نیوەی گەلی خۆی بکوژێت ودەربەدریانکا ؟ ئایە هەموو ئەو کارانەی لە یاساکانی ئێوەدا بە تاوانی جەنگ لە قەڵەم ئەدرێن، بەشار ئەنجامی نەداون ؟ "ئەم راستی ورووداوانە وراستییەکانی تر، شایەتی بەرامبەر بە دیموکراسییەکەتان دەدەن"، شایەتی ئەوە ئەدەن کە ئێوە هیچ بەهایەکتان نییە پارێزگاری لێ بکەن‌و، تاکە شت کە رەفتار وهەڵوێستەکانتان دەجووڵێنێتەوە؛ بەرژەوەندی وئاسایشی نێوخۆی وڵاتەکانتانە .

سەرۆکی ئەمریکا باسی ئازادی کرد وگوتی: "ئەمرِۆ برێك وڵات هەن دان بە بازارِی ئازاد دا دەنێن، بەڵام لە بەرامبەردا برِوایان بە کۆمەڵگەی ئازاد نییە ..."، بۆ ئەوەی ئەوەشتان بۆ بسەلمێنین کە ئەو وتارانە تەنها دیمەنێکی سیاسی وزاراوەی ئێکسپایەرن‌و، تەواو دوورن لە واقیع وئەخلاقەوە .. سەیر دەکەین هەر خودی ئەو ئەمریکایە، ماوە تا ماوە کۆمەڵە خۆپیشاندان ونارەزایەتی چینێکی ئەو کۆمەڵگایەی تیا رِوو دەدا، کە ماوەی چەند سەدەیە ئاخ وداخی رەگەزپەرستی دەکێشێ؛ کە ئەمریکییە بە ئەسڵ ئەفریقاییەکانن. ئەم چینە بە درێژایی مێژوودا تەنها بە پەنابردنە بەر هێز توانیویەتی مافەکانی خۆی بە دەست بێنێ، تا ئێستاش لە پەراوێز خستن وبایەخ پێ نەدانەوە دەناڵێنێ. ماوە تا ماوەش؛ کامێراکان چەند حاڵەتێکی کوشتنی رەگەزپەرستانەی دژ بەو چینەمان بۆ تۆمار دەکەن، لە دیمەنێکدا کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو قوربانی هەموو جارێکی ئەمریکییە بە ئەسڵ ئەفریقاییەکانە.

پاشان سەرۆك درێژەی زیاتری بە قسەکانی داو گوتی: "ئەوەی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا رِوو دەدا پرسی هەموومانە .. دەکرێ رێز لە داب ونەریتە ئاینییەکان بگیرێت، بەڵام لە

هەمان كاتدا مرۆڤ فێرە بیركار وزانستەكانی تر بێ ..." پاشان دەڵێ: "... ئەگەر ئاینمان؛ بمانگەیەنێتە جیاوازی ڕەگەزپەرستی و توندڕەوی ودەستدرێژی كردنە سەر خەڵك، یاخود ئەوەی ڕێگە لە ئافرەتان بگرین لە قوتابخانەكاندا بخوێنن،و بە پێی پێوەری نژادییەوە خەڵك هەڵسەنگێنین ... دوای دەڵێت: "تا ئێستا نموونەی هاوشێوەی ئەم چەشنە بیر كردنەوەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینین" ...

ئەم چەند ڕستە كورتانە؛ قسەكانی گوتارەكەی سەرۆكمان بۆ كورت وپوخت دەكەنەوەو تیشك دەخەنە سەر مەبەستی لە وتارەكەدا. گوتاری سەرۆكی ئەمریكا لە سەرەتاوە تا كۆتایی خەڵكی دابەشی دوو ڕیز وسەنگەر دەكرد، سەنگەرێك كە نوێنەری دادپەروەری وئازادی ومافەكانە، جگە لە ویلایەتە یەكگرتووەكان وگەلە هەڵبژێردراوەكەشی دەبێ كێی تر بێ ؟! .. سەنگەرێكی تریش كە نوێنەری دیكتاتۆریەت وستەم وزەوت كردنی مافەكان ودواكەوتوویی كلتوورییە، كە دیارە خۆی لە "ڕۆژهەڵات ناوەڕاست" وولاتی عەرەبدا دەبینێتەوە. هۆكاری ئەوەش لە دیدی ئۆبامادا؛ رادیكالییەتی ئاینی وزیاد بوونی كاریگەری عەشایەری ونژاد پەروەرییە ! كە بریتین لە سەرچاوەی كێشەكان. لێرەدا دەگەینە ئەوەی كە .. گوتارەكەی ئۆباما بە كورتی؛ "بانگەوازێك بوو بۆ جیهانگیری كلتووری" ویەكبوونی خەڵك لەو ئاراستەدا .

كەسێك پێی وا بێ كە ئەم بانگەوازە؛ بانگەوازی خودی ئۆبامایە .. زۆر بە هەڵەدا چووە، بەڵكو ئەو سیاسەتە بەرجەستەكەری سیاسەتی ئەم قۆناغەی ئەمریكایە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا. بە پێ تێڕوانینی ئەمریكا، تا ڕژێمەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست؛ ئەو ڕژێمانەی بە ئاشكرا بانگەشە بۆ بەها ئەمریكییەكان ناكەن؛ لێك نەترازێن ونەتوێنەوە - كە ئەگەری هەیە بە شێوازێكی یەك لە دوای یەك بێت،و ڕاستەوخۆ ڕوونەدا - جەنگ وشەڕ وشۆڕ لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەردەوام دەبێ. لە هەمان كاتدا تا ڕێكخراوە ئیسلامییە ئوسوڵی وڕادیكالەكان ون نەبن؛ جەنگ وشەڕ كۆتایی پێ نایەت. عەرەب وموسوڵمانان

جگە لە گرتنە بەری دیموکراسی هیچ ڕێگەچارەو حەلێکی تریان نییە، یا گەر حەز ئەکەی بڵێ؛ گرتنەبەری "دینەکەی ئەمریکا". قسەکانی ئۆباما دەربارەی بەربەستە فیکرییەکانی جیهانگیری کلتووری ویەکبوونی یەکجارەکی جیهان؛ قسەکانی پێشوو دووپات دەکەنەوە .. ئەو بەربەستانەی لە دیدی ئۆبامادا لە سێ لایەن دا بەرجەستە دەبن، کە :- "ئوسولێەت وڕادیکالی ئاینیو، عەشایەری، وزیادەڕەوی لە نژاد پەرستی دا"ـن .. ئەو بەربەستانە ئەوەن کە وا دەکەن موسوڵمانان لە حاڵەتی جەنگ وشەڕدا ڕزگاریان نەبێت. تەنها ئەو کاتە عەرەب وموسوڵمانان بە ئاسایش وئارامی دەگەن؛ کاتێ کە تەواوی بەستەر وناسنامە "نا دیموکراسییەکان"یان لێك دەترازێنو، "دینی ئەمریکا" قبووڵ دەکەن. ناسنامەی ئاینی بۆ نموونە؛ ڕێگە بە هاوڕەگەزبازی سێکسی نادات، کە ئەمریکا بانگەشەی بۆ دەکا .. ئەو کەسەی ئینتیمای بۆ هۆز وعەشیرەتەوە هەیە، پێی عەیب وعارە خەڵك بە ڕووتی لە جادەکاندا بسووڕێنەوە. ئۆباما دەیەوێ بڵێت: پیویستە خەڵك خۆیان بە خاوەنی کلتووری ئەمریکا بزانن، بۆ ئەوەی هەمووومان پێکەوە هاوبەشی ژیانی ئاژەڵانە بینو، ئەمریکا لە سەرکردایەتی جیهان دا بەردەوام بێ.

ئێمە ئیعتیراف بەوە دەکەین کە بیست ساڵەی ڕابردوو حوکمی جیهان لە دەست ئەمریکادا بوو، وتاکو ئێستاش هێزی گەورەی جیهانە. بەڵام لە بەرامبەریشدا پێویستە ئەمریکا دان بەوە دا بنێت؛ کە ئێمە بووین لووتمان برد بە خۆڵا ! ئەمڕۆ ئەمریکا بە هۆی شەڕی پازدە ساڵەی ڕابردووەوە؛ لە هەنگاوی ئەوەدایە دەستبەرداری سەرکردایەتی تاکڕەوانەی جیهان بێت. پێویستە ئەمریکا دان بەوەدا بنێ؛ کە موجاهیدان ڕاستی ئەمریکایان بۆ جیهان ئاشکرا کرد، وهێزی ئەمریکا وتوانایان مژیو، تا ئێستاش ئەمریکا لە گورزی موجاهیدان دەناڵێنێت وئەو ناڵاندنەی لە درێژەدا دەبێ؛ تا ئەو کاتەی - بە ئیزنی خوای گەورە - دەڕووخێت وتیا دەچێ. جەنگی ئەم جارەش جەنگی ئیرادەیە، هەر کەس توانای زیاتری ئارام وسەبر گرتنی هەبێ سەردەکەوێتو، جارێ جەولەی ئەم شەڕە کۆتاییان نەهاتووە .

ئەمریکا جیهانی حوکم کرد؛ بەڵام سوودی ئەمریکا بۆ ئەو جیهانە بە درێژایی ماوەی حوکم کردنیدا چی بوو ؟ چ بەهایەکی ئەخلاقی پێ ئیزافە کرد ؟ .. ئاخۆ جیهان چ خێرێکی لە ئەمریکا دەسکەوێ، کە پێوەری بەردوامی ئەمریکا بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیەتی .. بۆیە نابینی ئەمریکا دەست بۆ هیچ پرسێك بەرێت ورۆڵی تیا بگێڕێ، مەگەر ئەو پرسە تێکەڵ بە بەرژەوەندییەکانی خۆی بێتەوە. هەزاران مرۆڤ گیان لە دەست دەدەن، وجیهان لێی دەپرسێ :- بۆ رۆڵ ناگێڕیت ؟! کەچی وەڵامی ئەو ئەوەیە کە؛ ئەم پرسە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانمان تێك ناکاتەوە. کە لە هەڵوێستی تریشدا رۆڵ دەگێڕێ ودەستپێشخەری دەکا، پرسیاری لێ دەکەن؛ بۆ لێرەدا هەڵوێستت گرت ؟! وەڵام ئەوەیە؛ پرسەکە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر ئاسایشی ناوخۆمان هەیە. ئەمریکا ئا بەو جۆرە بیر دەکاتەوەو لەو خاڵە سەرەتاییانەوە دەجووڵێتەوە .. ئەوەی بەم جۆرەش بیر کاتەوە؛ ناتوانێ لە سەرکردایەتی جیهاندا بەردوام بێ .

جیهان هەمووی لە ئەمریکا بێزار بووە، تەنانەت کەش وهەواش لە دەست ئەمریکا وسیاسەتەکانیەوە دەناڵێنێ. لە دوا ئامارەکانی رێکخراوی تەندروستی نێودەوڵەتیدا؛ باس لەوە دەکرێ کە ٩٢٪ـی دانیشتوانی زەوی هەوای پیس هەڵدەمژن، وساڵانە ٦،٥ ملیۆن کەس بە هۆی پیس بوونی هەواوە گیانیان لە دەست دەدەن. هۆکاری گەورەی پیس بوونی هەوا بۆ بڵاوبوونەوەی گازەکانی پەنگخواردنەوەی گەرما یاخود گەرم بوونی گۆی زەوی Greenhouse Gases دەگەڕێتەوە، کە ئەمریکا بە نسبەتی ٣٦،١٪ بەشداری بەرهەمهێنانیانە. لەگەڵ ئەوەشدا وتا ئێستا ئەمریکا هەنگاوی کارای بەرەو کەمکردنەوەی ڕاستەقینەی ئاسەوارە زیانبەخشەکانی ئەو گازانە نەناوە. بەڵکو تەنانەت برێك لەو بڕیارانەی، کەمکردنەوەی بەکارهێنانی مادەی بەرهەم هێنەری گازەکانی پەنگخواردنەوەی گەرما دەسەپێنن، نارەزایەتی ئەمریکایان بە دەست هێنا وپێی قبووڵ نەبوون. سەیرە بە ڕاستی کە ئۆباما گاڵتە بە عەقڵی جیهان دەکات وپڕ بە ڕوو باسی پێویستی ڕوو بەڕوو بوونەوەی بوێرانە دەکا؛ بەرامبەر بە مەترسی بڵاوبوونەوەی گازەکانی گەرمبوونی گۆی زەویدا .. وەك وایە وڵاتەکەی خۆی یەکەم وڵات بێ ئەو یاسایانەی لە خۆدا سەپاندبێت

ومەترسییەکانی کەم کردبنەوە. لەوەش بێ حەیاتر وگاڵتەجارانەتر ئەوەیە کە دەڵێ: "پێویستە تەکنەلۆجیا بخەینە بەر دەست وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان، بۆ ئەوەی وزەی پاك بەرهەم بێنن". کە پێدەچی قسەکانی هۆکاری ئەو گازانە دیاریکەن وئاڕاستەی بەرەو وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بەرن، یاخود وڵاتانی جیهانی سێیەم – وەك ناویان لێ نراوە.

لە دواییدا باسی ڕادیکالیەت وئوسوڵیەتی ئاینی کرا وبە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆوە باسەکە چووەوە سەر ئیسلام، کە گوتی؛ "ئەو بیر وبڕوایانە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دەبینین" واتا لەو وڵاتانەی بڕوایان بە ئیسلامە، وەك وڵاتی عەرەب و وڵاتانی تر .. دەشڵێ؛ "دەکرێ ئێمە ڕێز لە داب ونەریتە ئاینییەکان بگرین، ولە هەمان کاتدا خۆمان فێری بیرکاری وزانستەکانی تر بکەین". ئەم ئاماژەیەش، ئاماژەیەکی نادروستە؛ بۆ ئەوەی بیسەر وا خەیاڵکا دینی حەق دژی زانستە پراکتیکەکانە. بەڵام دەرکی ئەوە ناکا، یاخود خۆی لە بنچینەی هەڵقوڵانی ئەو زانستانە لادەدا، کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەست بە پێشکەوتن وڕەنگدانەوەیان دەکەین. دەی ئەگەر خەوارزمییەکان Algorithms نەبوونایە ، ئەمڕۆ کۆمپیوتەرمان ئەدی ؟! ئەو تاقیگە کیمیاییە نەبووایە کە موسوڵمانانی ئەندەلوس بەرهەمیان هێنا، ئاخۆ ١١٨ توخمە کیمیاییەکانمان ئەبینی ؟! موسوڵمانان توانیان بەردی بناغەی زۆرێك لە زانستەکانی سەردەم دانێن وکەوتنە لێکۆڵینەوەی زانستییەوەو وپازێکی گەورەیان بە زانست دا، تاوەکو ئێستاش جیهان لە ئاسەوارەکانیدا دەژی. لەگەڵ ئەوەی موسوڵمانانیش لەو کاتەدا سەرانی جیهان بوون، بەڵام هەرگیز زانستیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان وکوشتنی مرۆڤەکان نەخستە کار. ئاینی ئیسلام ئەو ئاینەیە کە پێوەر وبەها بۆ کاری مرۆڤەکان دادەنێت وهانیان دەدا زەوی ئاوەدان کەنەوەو لەگەڵ مرۆڤایەتی دا دادپەروەر بن، ئەمەش سیفەتێکە کە لە شارستانییەتی ڕۆژئاوایی وئەمریکی - بە شێوەیەکی وردتر - نابینرێتەوە. ئەگەر باسی هەردوو دینی مەسیحی ویەهوودی بکەین، کە گۆڕاون ودەستیان لێ وەردراوە، دیارە کە توانایان نەبوو لەگەڵ زانست دا پێك بێن وبە یەکەوە بسازێن، بۆیە کڵێسا دەستی کردە دژایەتی زانایان وزانایانی کوشت؛ تا ئەو کاتەی شۆڕشی عەلمانیەت وسیکولاریزم وەك چارەسەرێکی مام ناوەند هەڵگیرسا، کە دین

وزانستی پراکتیکی لێك جیا کردنەوە. ئا لەو کاتەوە زانستی پراکتیکی لە مانا ئەخلاقییەکان داماڵیو، زانست خرایە خزمەتی سوود وبەرژەوەندی وهێزەوە. ئیسلام وەکو دین؛ تاکە دینێکە توانای ئەوەی هەیە زانستەکانی دونیا ودین وئاین بە یەکەوە کۆکاتەوە وسازانێکی بێ وێنەیان لە نێواندا دروستکاو، پێمان دەڵێ کە پەروەردگاری ئەم جیهانە یەکێکەو دینەکەی یەك دینە. ئێمە بە ئیسلام پوخت وپاراو بووین وئیسلام ئەوەی فێر کردین چۆن زانست لە ئاوەدان کردنەوەی جیهان وخۆشبەخت کردنی مرۆڤایەتی دا بە کار بێنین، نەك لە تێکدانی دا بە بۆمبی ئەتۆمی وگازە زیان بەخشەکانەوە.

بۆیە تەنها یەك ئاین توانای ڕاست کردنەوەی مرۆڤایەتی هەیە، ئەویش ئاینی ئیسلامە، "مێژووش شایەتی ئەدات ورِووداوەکان شایەتی ئەدەن". لە ڕاستیدا هیچ کام لە بەها وسیستمە دەستکردەکانی مرۆڤ نموونەی ژیانێکی تەواو پێشکەش ناکەن .. ژیانێك بە کەڵکی مرۆڤایەتی بێت ولە دەسەڵاتی زلهێزان بیانپارێزێ، تەنها دینی ئیسلامیمان نەبێ.

ئێمە چاك لەوە دڵنیاین، کە ئیسلام وا بەرێوەیەو گەڕانەوەی بۆ حوکمی مرۆڤایەتی نزیکە، ئەوەی لەسەر ئێمەی موسوڵمانیشە ئەوەیە ئەو گومراییە برووخێنین، کە ئەمریکا سەرکردایەتی دەکات‌و، بە دینی پاکەوە دادپەروەری وخۆشبەختی مرۆڤایەتی بسازین. ئاینی ئیسلام ئەمرمان پێ دەکا زانست بۆ ڕووخاندنی گومرایی بە کار بێنین، کە زانایان بە زانستەکانی هێزی ناو دەبەن. بە زانست، قارەمانان توانیان تەلارەکانی بازرگانی جیهانی – World Trade Center - وبینای پێنتاگۆن برووخێنن. بە زانستیش؛ توانیمان فرۆکەخانەو دەزگا ئەمنییەکانتان بپەڕێنین. بە زانستیش ئەوەی پێتان ناخۆشە دەیبینن – بە کۆمەك ویارمەتی خوای پەروەردگارەوە. زانست ئامراز وسونەتێکە، بەڵام پشت وپەنای ئێمە تەنها بە خوای پەروەردگارە.

كەسێك كە لە گوتاری ئەو دواییەی ئەمریكا لە كۆنگرەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان دا بڕوانێ ، لە نێو قسەو لە بەینی وشەكاندا؛ هەست بە نەفەسی كابرایەكی ماندوو لە شەڕ وشۆڕ وجەنگەوە دەكات .. هەناسەی كەسێكی پاشكەوتوو دەبینێ، كە خۆی دەنوێنێت ودەڵێ؛ پێویستە هەمووومان هاوبەشی یەكتر بین ولە یەكتر نزیك بینەوە. هەست بە ون بوون ونەمانی وشەو زاراوە لووتبەرزەكان دەكا .. ئەمڕۆ؛ "ئەمریكای ژمارە یەك" نەما، ئێستا ئەمریكا دەڵێ؛ "هەمووومان یەكین" ! .. ئەمەش؛ لە پاش جیهاد وسەبر وئارام گرتنەوە هاتە دی، بڕێك كاتی تریشمان گەرەكە، ئیتر بە جارێ ئەمریكا لە بیر دەكەین إن شاء الله.

ئەگەر بۆمان كرا لە ژمارەكانی داهاتوودا باس لە هەنگاوی كارای تر دەكەین، لە ڕێگەی ڕووخاندنی سیستمی جیهانگیری دا .. بۆ ئەوەی سیستمی ئیسلامی سەر ڕاست ورەشیدانەی بێتە جێ، **وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ** – بەڕاستی خوای گەورە زاڵە بەسەر كارو فەرمانەكانی خۆیدا، بەڵام زۆربەی خەڵكی بەمە نازانن.